# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصــفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ

وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحـبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً

**ئەم دیوانە بریتیە لە دیوانی شێخی بەتوانا و گەورەی تەریقەتی پیرۆزی ڕیفاعی کە ئەویش حەزرەتی شێخ موحەمەد مەهدی بەهائەدینی ڕەواسی ڕیفاعیە ، کە ئێستاش لە تەکیەی ڕیفاعیەکان شیعرەکانی بە شێوەی ستایش و سرودی ئاینی لە کۆڕی زیکرەکاندا دەوترێتەوە و شعرەکانی لایەنێکی عیرفانی و خوداناسی قوڵی تێدایە و لەناو شعرەکاندا ورەبەرزی ئەم شێخە پایەبەرزە لە بەرامبەر پەیوەست بوون بە ڕێبازی ڕیفاعی هەستی پێ دەکرێت ، درود بۆ ڕووحی پاکی و بەو هیوایەی ئەم بەرهەمە ببێتە جێگای ڕەزامەندی خوێنەرانی بەڕێزی وڵاتی پیرۆزی کوردستان**

**هەژیر**

# پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ بەهائەدینی ڕەواس

شێخ بەهادینی ڕەواس ناوی موحەمەد مەهدیە کوڕی سەید عەلی کوڕی سەید نورەدین کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی سەید موحەمەد کوڕی سەید بەدرەدین کوڕی سەید عەلی ردینی کوڕی سەید مەحمودی سۆفی کوڕی سەید موحەمەد بورهان کوڕی سەید حەسەنی غەواس کوڕی سەید حاجی موحەمەد شا کوڕی سەید موحەمەد خوزام کوڕی سەید نورەدین کوڕی سەید عەبدولواحید کوڕی سەید مەحمودی ئەسمەر کوڕی سەید حوسەینی عێراقی کوڕی سەید ئیبراهیمی عەرەبی کوڕی سەید مەحمود کوڕی سەید عەبدولڕەحمان شەمسەدین کوڕی سەید عەبدوڵلا قاسم نەجمەدین کوڕی سەید موحەمەد خوزام سەلیم کوڕی سەید شەمسەیدن عەبدولکەریم کوڕی سەید ساڵەح عەبدولڕەزاق کوڕی سەید شەمسەدین کوڕی سەید سەدرەدین عەلی کوڕی سەید ئەحمەد عیزەدینی صەیادی نەوەی سەید ئەحمەدی ڕیفاعی کوڕی سەید عەبدولڕەحیم کوڕی سەید عوسمان کوڕی سەید حەسەن کوڕی سەید عسلە کوڕی سەید حازم کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی سەید عەلی مەککی کوڕی سەید رفاعە کوڕی سەید مەهدی کوڕی سەید ئەبو قاسم موحەمەد کوڕی سەید حەسەن کوڕی سەید حوسەین کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی سەید موسای سانی کوڕی سەید ئیبراهیمی مورتەزا کوڕی ئیمام موسای کازم کوڕی ئیمام جەعفەری سادق کوڕی ئیمام موحەمەدی باقر کوڕی ئیمام عەلی زەینەلعابدین کوڕی ئیمام حوسەین کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (سەلامی خوایان

**لەسەربێت) [1] ، لە دایکیشیەوە ڕەچەڵەکەی بۆ شێخ عەبدولقادری کەیلانی دەگەڕێتەوە [٢] ، بە ڕەواس دەناسرا چونکە سەری برژاوی بەرخی دەفرۆشت لە بەغداد ، ئەمە مانا ئاشکراکەیە ، مانا پەنهانەکەشی ئەوەیە کە بەمانای سەرداری پیاوچاکان دێت ، پێشی دەوترێت بەهادین کە ئەمەشیان نازناوێک بوو لە زیکردا پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) پێی بەخشیبوو ، هەروەها پێی دەوترێت غەریبی غورەبا ، پێشی دەوترێت ئەبولمەکاریم و ئەبولبەراهین [٣ ] ، شێخ ڕەواس لە عێراق لەدایکبووە لە سوقولشیوخ سەر بە پارێزگای بەسرە لە ساڵی (١٢٢٠ک – ١٨٠٥ز) ، لە ڕێگەی باوکیەوە فێری قورئانی پیرۆز بوو ، هەروەها قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد لەسەر دەستی مەلا ئەحمەد لە ناوچەی سوقولشیوخ بە هەر حەوت خوێندنەوەکە کە ئەوکات تەمەنی نۆ ساڵ بووە ، کاتێک تەمەنی دەبێت بە سیانزدە ساڵ ، تاعون بڵاودەبێتەوە لە ناوچەکەیان و بەهۆی ئەمەشەوە دایک و باوک و برا و خوشکەکانی دەمرن ، تەنها خۆی دەمێنێتەوە ، بۆیە سەید عەبدوڵلای خاڵی دەیباتە لای خۆی و بەخێوی دەکات هەتا ساڵی (١٢٣٥ک–١٨٢٠ز) خاڵی لە شاری مەدینە کۆچی دوایی دەکات وئەوکات شێخ ڕەواس تەمەنی پانزدە ساڵ دەبێت [٤] ، پاشان ساڵی (١٢٣٨ک–١٨٢٣ز) دەچێت بۆ میسر و لە زانکۆی ئەزهەر دەمێنێتەوە بۆ ماوەی سیانزدە ساڵ ، هەتاکوو لە هەموو زانست و زانیاریەکدا دەکاتە ئەوپەڕی [٥]**

بڕوانامەی لە زانستی فەرمووده وەرگرتووە کە زنجیرەی بڕوانامەکە بەم شێوەیەیە : شێخ موحەمەد بەهادینی ڕەواس وەری گرتووە لە شێخ عەبدولمونعیمی بەغدادی و شێخ ئەحمەدی ئەزهەری و سەید ئیبراهیمی ڕیفاعی بەصری کە ئەوانیش وەریانگرتووە لە مامۆستاکانی خۆیانەوە هەتا فەرموودەزان شەمسەدینی بابلی ئەویش لە شەمس موحەمەدی کوڕی شەهاب ئەحمەدی ڕەملی ئەویش لە شێخی ئیسلام زەکەریای ئەنساڕی ئەویش لە فەرموودەزان ئیبن حەجەر ئەویش لە ئیبراهیمی تەنوخی ئەویش لە ئەحمەدی کوڕی ئەبو تاڵیبی حەجار ئەویش لە بورهانەدین حوسەینی کوڕی موبارەک ئەویش لە عەبدولئەوەلی کوڕی عیسا ئەویش لە ئەبولحەسەن عەبدولڕەحمانی داودی ئەویش لە عەبدوڵلای سەرخەسی ئەویش لە موحەمەدی غەبری ئەویش لە ئیمامی بوخاری وەری گرتووە [٦]

هەروەها تەریقەتی وەرگرتووە لە شێخ ئیبراهیمی ڕیفاعی بەصری ئەویش لە شێخ ئەحمەد ئەویش لە عەبدوڵلای بەسڕی عەباسی ئەویش لە سەید نورەدین حەبیبوڵلا حودەیسی ڕیفاعی ئەویش لە سەید حوسەین بورهانەدینی ئالو خوزامی ڕیفاعی ئەویش لە سەید نورەدین ئەویش لە خوزامەدینی ڕیفاعی بەسڕی ئەویش لە سەید شەعبان ئەویش لە سەید تاجەدینی نەقیب ئەویش لە شێخی ئیسلام سیراجەدینی ڕیفاعی ئەویش لە مەخزومی ئەویش لە سەید

جەمالەدینی ڕیفاعی ئەویش لە سەید قوتبەدینی ڕیفاعی ئەویش لە شەمس موحەمەد صەیادی ئەویش لە شێخی ئیسلام عەلی صەیادی ئەویش لە شێخ ئەحمەد عیزەدینی صەیادی ئەویش لە حەزرەتی شێخ سەید ئەحمەدی ڕیفاعی [٧]

چەندین بەرهەمی هەیە ، لەوانەش : [٨]

1. طي السجل
2. بوارق الحقائق
3. رفرف العناية
4. الوثيقة الكبرى
5. الوثيقة الوسطى
6. الوثيقة الصغرى
7. فصل الخطاب
8. مراحل السالكين

## سەرچاوەکان :

**[١] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ١٨–١٩**

**[٢] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ١٩**

**[٣] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ١٣–١٤**

**[٤] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ١٧**

**[٥] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ٢١**

**[٦] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ٢٢**

**[٧] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ٢٣**

**[٨] عبدالقادر الرحباوي : بهاء الدين الرواس حياته – فكره – مناقبه ، دار البشائر للطباعة و النشر و التوزيع – دمشق ، ٢٠١٠ ، چ ١ ، ل ٢٤**

## شیعری یەکەم : في كل عصر من علي واحد

في كل عصر من عليٍّ واحد تعنو إليه من الفحول رقاب

ويموج بحر الفيض في عتباته وتلوذ في ساحاته الأقطاب

والله فضلاً لا يخيب وجهه ودعاؤه ضمن الغيوب يجاب

**لە هەمــوو ســەردەمێکدا عەلیــیەک هەیە کە هەمــوو مەردان ســەری بــۆ دادەنــوێنن ، دەریــــای بەخشـــــندەیی ئەو شـــەپۆلدارە و هەمـــــوو پیاوچاکـــــان و خواناســــان و جەمســەرگیرەکان پەنــا دەبەن بــۆ مەیــدانی ئەو ، ســوێند بە خــودا پێکەیەکیــان هەیە کە هەرگیز نزا و پاڕانەوەیان ڕەت ناکرێتەوە و قبوڵە هەرکات نزا بکەن**

## شیعری دووەم : إذا سمعنا ذكر أحبابنا

إذا سمعنا ذكر أحبابنا

نمزج ناراً بدموعٍ غزار

يميتُ حبُّ الحبِّ أربابه

وما على من مات في الحبِّ عار

**کاتێــک کوێمــان لە یــاد و باســی خۆشەویســتانمان بێــت ئــاگر تــێکەڵ بە فرمێســک دەکەیــن ، خۆشەویســتی ئەوینــداران دەکوژێــت ، هەرکەســیش بە خۆشەویســتی بمرێــت هیچ شورەیی و شەرمەزاری لەسەر نیە**

## شیعری سێهەم : للحق نور لیس یحجب ضؤه

للحقِّ نورٌ ليس يحجب ضؤهُ

عتمٌ ولا يطوي هداه ساتر

تخفيه أوهام الحواسد وهو في

أفهامهم بسنا الحقيقة ظاهر

تترادف الأنصار ضدَّ الحقِّ وال

جبار ينصره ونعم الناصر

فترى القلوب الحقَّ غير منكَّرٍ

ويضيءُ وربُّك قادرُ

**ڕاستی ڕووناکیەکەی هەیە کە هیچ شتێک بەری ناگرێت و ناتوانێت دایپۆشێت ، خەیاڵی ئیرەییبەرەکان دایدەپۆشێت ئەگەرچی ئەوە بیرکردنەوەی ئەوانە ئەگەرنا دیار و ڕوونە ، هەرچەندە ئەوانەی دژ بە ڕاستین زۆر بن ، لەکۆتاییدا خودا ڕێی**

**ڕاست سەردەخات و باشترین سەرخەرە ، دڵەکان ڕاستی دەبینن و نکوڵی لێ ناکەن کاتێک ڕووناکیەکەی دەربکەوێت و خوداش بەتوانایە کە هەرچی بوێت دەیکات**

## شیعری چوارەم : طغى فرعون حتى قال إني وموسى مغشيا عليه

طغى فرعون حتى قال إني وموسى مغشيا عليه

وأغرق ذاك وانكشف التجلي لموسى بالعلى في محضريه

فخلِّ أخا الغوى واغلظ عليه ووال أخا الهدى واركن إليه

ووحِّد من جلى هذا وهذا تديرهما الشؤن برمزتيه

فميمنةٌ وميسرةٌ طواها طوى ميزانه في كفَّتيه

فخذ شرع النبيِّ له طريقاً ونم بالأمن متكلاً عليه

**فیرعەون ئەوەندە لەخۆبایی بوو هەتا وتی من خوام ، کەچی موسا لەسەر کێوی طور بورایەوە کاتێک نوری خودایی بینی ، فیرعەون خنکا لەناو ئاو و موسا نوری خودایی لەو بەرزاییە بینی ، بۆیە دووربکەوە لە هاوڕێ و برادەری خراپ و لۆمەی بکە ، لەهەمان کاتدا برادەری چاک بکە بە دۆست و لەگەڵیدا ببە ، گرنگی بە هەموو لایەنێکی چاکی هەردوولایان بدا بۆ ئەوەی هانیان بدەی ، ئاستەنگی و ئاسانی لە هەردوو لای تەرازووی خودادان ، هەر بۆیە شوێنی پەیامهێنەر بکەوە و ڕێگاکەی بگرەبەر و بەبێ خەم بنوو کاتێک پشتیان پێ دەبەستیت**

### شیعری پێنجەم : یا كاشف الضر عن أیوب یا سندا

یا كاشف الضُرِّ عن أیوب یا سنداً

باللطف زحزح عن یعقوب أحزانا

یا مخرجاً یوسفاً من جبِّه ومن ال

سجن العسیربحض الفضل إحسانا

یا مبرداً نار إبراهیم خذ بیدي

وزد فؤادي بثلج اللطف إیمانا

**ئەی لابەری بەڵا و نەهامەتی لەسەر حەزرەتی ئەیوب ، ئەی پشت و پەنا ، ئەی بەسۆز و لابەری دڵتەنگی و خەم لەسەر حەزرەتی یەعقوب ، ئەی دەرهێنەری حەزرەتی یوسف لە بیر و زیندان ، ئەی بەخشندە ، ئەی ساردكەرەوەی ئاگری حەزرەتی ئیبراهیم دەستم بگرە ، لە دڵمدا بە بەفری بەخشندەیی باوەڕم زیاتر بكە**

## شیعری شەشەم : والله لولا الله ما اهتدينا و لا تصدقنا و لا صلينا

والله لولا الله ما اهتدينا ولا تصدَّقنا ولا صلَّينا

فأنزلن سكينةً علينا وثبِّت الأقدام إن لاقينا

يا ربَّنا يا واهب العناية يا محسناً باللطفِ والوقايه

من برِّك التوفيق والهدايه فأوصلن منك الهدى إلينا

**سوێند بە خودا ئەگەر خودا نەبوایە نەدەهاتینە سەر ڕێگای ڕاست ، نە چاکەمان دەکرد و نە نوێژ ، خودایە ئارامی بخە ناو دڵەکانمان ، پێکانمان جێگیر بکە کاتێک دێینە خزمەتت ، خودایە ئەی بەخشەری بەزەیی ئەی چاکەکار بە سۆز و پاراستن ، لە تۆوە سەرفرازی و ڕێنوێنی دێت ، لە لای خۆتەوە ڕێنوێنیەک بۆ ئێمەش بنێرە**

إجابة الدعاء يا ستار شأنك للداعين يا غفار

بذا أتي الآيات والأخبار ونحن عن محمَّدٍ روينا

يا ربنا ندعوك  بالقرآن وبالنبي الطاهر العدنان

عمِّر لنا القلوب بالإيمان حتى نقرَّ بالقبول عينا

وەڵامـــدانەوەی نزاکـــان ئەی داپۆشـــەری تـــاوان کـــاری تـــۆیە ئەی لێبـــوردە ، ئەی ئەوەی هەواڵ و فەرمایشـــتەکانت گەیانـــدە ســـەر زەوی و ئـــێمەش لە حەزرەتـــی مـــوحەمەدەوە (ســـەڵەوات لەســـەر خـــۆی و بنەمـــاڵەکەی) گێڕامـــانەوە ، خـــودایە داوات لێـــدەکەین بـــۆ خـــاتری قورئـــان و پەیـــامهێنەری خـــاوێنی بنەمـــاڵەی عەدنـــان ، دڵمـــان پـــڕ بـــکە لە بـــاوەڕ تاکو لە چاوی ڕەزامەندی تۆ جێگیربین

یا ربنا بالكتب العظام والأنبياء السادة الكرام

بالأولياء الخلَّصِ الإعلامِ إغفر لنا بالفضل ما جنينا

بسرِّك المضمر في الغيوب وسرِّه المفرغ في القلوب

أستر لنا كثائف العيوب ولا تسلِّط أحداً علينا

خـــودایە بـــۆ خـــاتری کتێـــبە مەزنەکـــان و پەیـــامهێنەرە بەڕێزەکـــان و دۆســـتە ڕاســـتگۆکانت کە وەک شـــاخ بڵنـــدن ، هەرچیمـــان کـــردووە لێمـــان ببـــورە ، بـــۆ خـــاتری ئەو نهێنـــیەت کە لە پەنهانەکـــانە و ئەو پەنهـــانەش لە نـــاو دڵـــدایە ، کەموکوڕیەکانمـــان داپۆشـــە و کەس بەسەرمان زاڵ مەکە

یا من إليك المشتكى فيما يرى من كلِّ كربٍ يعتري الدهر الورى

عن كلِّ كربٍ منه تشتدُّ الغرى بنشر سرِّ لطفك انطوينا

يا من به قد قامت الأشياء وثبتت بأمره السماء

اغث فقد تعدَّت الأعداء فرام بسهم البطش من رمينا

ئەی ئەو کەسەی سکاڵا دەهێنینە خزمەتت لەکاتی هەر نەهامەتیەک کە بەرگەی نەکرین و زیانمان لێ تاڵ بکا ، لە هەموو بەڵا و ناخۆشیەک کە تاقەت پروکێنە ، ئەوا بە سۆز و بەخشندەیی تۆ هانای خۆمان ئەدەین ، ئەی ئەو کەسەی دوونیا پێتەوەیە جێگیرە و بە فەرمانی خۆتە ئاسمان جێگیرە ، فەریادڕەسمان ببە وا دوژمنەکانمان سنووردەبەزێنن ، تیرەکەمان بکە بە تیرێکی کەورە و کاریکەر کاتێک بەناوی تۆوە هەڵی بدەین

لقد رمينا فاحكم الغصابة وقد دعونا فارزق الإجابة

جئنا نناديك مع الإنابة وكم اجبت حال ما نادينا

قمنا نصلي بصحيح النيِّه على النبيِّ سيِّد البريِّه

صلِّ عليه واهده التحيَّة مع السلام كلَّما صلينا

**ئەوە هەڵمـان دا تیـرەکە تـۆش ئامـانج بپـێکە ، پـاڕاینەوە تـۆش قبـوڵی بـکە لێمـان ، هـاتوین نـاوت بهێنـین لەکـاتی نەهامەتی ، چەنـدە دۆخمـان باشـتر دەبێـت هەرکـات نـاوت دەهێنـین ، هەسـتیان بە مەبەسـتێکی ڕاسـتەوە سـەڵەواتمان دا لەسـەر پەیـامهێنەر کە گەورەی هەمـوو بـونەوەرانە ، تـۆش سـەڵەواتی لەسـەر بـدە و سـەلاممانی پـێ بـگەیەنە هەرکات سەڵەواتمان دا**

## شیعری حەوتەم : تدوس بساط الله والقلب فاقد

تدوس بساط الله والقلب فاقد

وتأكل زاد القوم السرُّ جاحد

وتزعم طيشاً أنَّ طورك مبهمٌ

لديهم ومعناهم لمعناك ناقدُ

دێیـــتە ســـەر بەرمـــاڵی خـــودا و دڵـــت ئامـــادە نـــیە و ونە ؟ خـــواردن و خـــۆراکی ئەوان (ئەهلـــی تەریـــقەت و ڕیچـــکەی ســـۆفیگەری) دەخۆیـــت و دواتـــر دژیـــان دەوەســـتیتەوە ، پێـت وایە کێـوی طـوری تـۆ لەلای ئەوان بڵنـدە لەکاتێکـدا ئەوان هەرچـی بڵـێن ڕەخـنە لە وتەکانیان دەگریت

تخون عقود الله بعد انعقادها

وأقبح شيءٍ أن يزلَّ المعاهد

هجمت لغابِ الليث حاضرٌ

فطرفك يقظانٌ وقلبك راقدُ

پەیمان و بەڵێنی خودایی دەشکێنیت دوای دامەزراندنی و ناشرینترین شتێک هەیە هەیە شکاندنی پەیمانەکانە ، هێرشت کردە سەر دارستانی شێرەکان ، چاوەکانت کراوەن و بە خەبەرن لەکاتێکدا دڵت داخراوە و بێخەبەرە

أتحسبُ أنَّ اللّه سفهت غافلٌ

وأنَّ الوحا عن فتق رتقك قاعد

فتوَّتنا منَّت عليك بستر ما اق

ترفت وللمعنى دليلٌ وشاهدُ

پێت وایە خودا غافڵ و بێئاگا بێت لە کردەوە کەمژەییەکانت ، پێت وایە خوا نەتوانێ ئەو کون و کەلەبەرانەی دروستت کردووە پڕی بکاتەوە ؟ ، فەتواکانی ئێمەیە کە داپۆشراوی کردویت لەوەی ئەنجامت داوە و هەرچیەک بڵێین بەڵگە و شاهیدی لەسەر هەیە

ونحن أسودُ الغيب في غابة العبا

مصادرنا محفوظةٌ والموارد

لنا في مفازات البرايا خوارق

وفي طيِّ فيفاءِ الخفايا عوائدُ

ئێمەین شێرەکانی زانستە پەنهانیەکان لە دارستانە شاراوەکاندا ، سەرچاوە و قسەکانمان پارێزراوە و هەرچیەک بیڵێین ، دەتوانین ئەوەی بمانەوێت بەو شێوەیەی ویستمان لێ بێت بەدەستی بهێنین و لە شاردنەوەی پەنهانەکانیش دەسەڵاتمان هەیە بەشێوەیەک کەس نەتوانێ دەستی پێ بگا

وفي قمَّةِ المجد المنيع منابرٌ

وفي ساحة العزِّ الرفيع مساجدُ

وفي سدَّةِ التصريف عزمٌ مؤَيَّدٌ

وفي سدرة السرِّ اللطيف موائدُ

لەو پەڕی لوتکەی بڵندیدا ئێمە مینبەرین و لە مەیدانی سەربەرزان و شکۆمەندان ئێمە مزگەوتین ، لە دەسەڵاتداری و ئەنجامدانی کاری مەعنەوی توانادارین ، لەو پەڕی نهێنیە خوداییەکانیش ئێمە هەڵگرین و ڕاخەرین

سيطويك منا سهمُ فتكٍ مجلجلٌ

تذوبصُ لمعناهُ الجبال الجلامدُ

ستأخذك الأسياف من كلِّ جانبٍ

ولا الجدي يلوي بأسها أو عطارد

**تیرێکی کوشندە و کاریگەر لە ئێمەوە بەرت دەکەوێت ، بە شێوەیەک کە شاخە جێگیر و خۆڕاگر و بەتینەکانیش لە تاو ئەو تیرەدا بکەونە لەرزە و هەژان ، شمشێرت (شمشێری مەعنەوی کە کاریگەری لە ڕووح و دڵ دەکات نەوەک جەستە) بۆ دێت لە هەموو لایەکەوە ، بەشێوەیەک کە نە کەلوی جدی و نە هەسارەی عەتارد دەتوانن پارێزگاریت لێ بکەن**

فرملك منسوفٌ وجفرك كاذبٌ

وعزمك منقوصٌ وهمُّك زائدُ

وحبلك منقوضٌ وصفوك زائلٌ

ومالك في كلِّ البرايا مساعد

**لەمەکەت بە خاکدا دەچێت و پێشبینی و پێشهاتەکانت درۆ و ناڕاستن ، ویستت کەموکوڕی تێدایە و خەمت زیاد لە پێویستە ، پەتەکەت پچڕاوە و چاکیەکانت دەڕۆن ، لە هەموو بونەوەراندا کەس نابێت بە فەریادڕەست**

تأمَّل ترانا روح كلِّ حقيقةٍ

لها في سويداء المعالي مساند

تنمَّق عنا محكم الفتح في الحمى

لأهل الحمى يدري بذاك المشاهد

**جوان ورد ببەرەوە دەبینیت ئێمە بنچینەی هەموو ڕاستیەکین ، کە لەوپەڕی زانستەکان ئێمە ڕاگرین ، لەناو خەڵک بیدرکێنە و بیرازێنەوە ستایش و باسی ئێمە کە خودا چی پێ بەخشیوین ، چونکە بەشێک لە خەڵک خۆیان بە چاوی خۆیان ئەوەیان دیوە**

وما مرَّ في نظم الوجودات سابقٌ

بآبائنا إلا الصفيُّ المجاهدُ

مضوا بطريق ابن الذبيحين سيِّدٌ

وحبرٌ ومعمورُ الجوانب عابدُ

**لەوانەی پێش ئێمە لە باوک و باپیرانمان ئەوانەی هەبوون هەموویان تێکۆشەر و خاوێن بوون ، بەرێگای سەیدی کوڕی دوو سەربڕدراو ڕۆیشتن (لێرە سەید مەبەست پێی پەیامهێنەرە {سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی} و دوو سەربڕدراو ئاماژەیە بۆ حەزرەتی ئیسماعیلی**

**کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی عەبدوڵڵای باوکی پەیامهێنەر) کە هەموویان زانا و دانا بوون و پێگەیشتووبوون لە هەموو ڕویەکەوە و خوداپەرست بوون**

وبحرٌ من العرفان يقذف جوهراً

ومنه لأعناق الرجالِ قلائدُ

ورثت الأولى قومي فقمت مبرقعاً

وكوكب عزِّي انحطَّ عنه المراصدُ

**دەریایەک بوون لە خودا ناسی کە گەوهەریان دەردەخست و بۆ ملی پیاوان بووبوون بە ملوانکە ، لەناو بنەماڵەکەمان پایەداریەکە بە من بەخشرا بۆیە بە کەشاوەیی هەستام ، هەسارەی شکۆداریم کەس نەیتوانی ڕوانگەی بکا**

فنعتي في نظم التسلسلِ مفردٌ

وسمتي بنهجِ ابن العواتك واحدُ

ظهوري بأمراطِ الخفاء محجَّبٌ

تقوم به زهر الجباه الأماجد

**له زنجیرەی ڕێچکەکەم من پێکەم تێیدا کەموێنەیە ، درێژەپێدەری ڕێچکەی خاتوونە جوان و نەجیب زادەکانم (العواتک واتا داپیرەکانی پەیامهێنەر سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، دەرکەوتنم شاراوە و پەنهانە و نابینرێت ، ئەوەی وادەکات دەرکەوین نێوچەوانی کەشی مەردانی دیوانی خودایە**

ويملأ أقطار الوجودات كلِّها

فيبهت أفاك ويحتار حاسدُ

أنا الواحد المنعوتُ في صحف الخفا

لأهل الوحا مني عليَّ شواهد

**کە دەربکەوم دەبمە چرا بۆ هەموو بونەوەران ، ئەوەی بوهتانی کردبێ ئەوکات ئاشکرا دەبێ درۆکە و ئەوەشی ئیرەیی پێمان بردبێ سەرکەردان دەبێ ، من یەکێکم کەوا لە کتێبە پەنهانیەکان ناوم هێنراوە ، خوداناسان دەمناسن و شایەتن بەسەرمدا**

سيعرفني في منهجِ السرِّ راكعٌ

ويبصرني في مهمه السيرِ ساجدُ

وتجلى كؤسي بالبراهين والهدى

فيظمأ ذو فقدٍ ويشرب واجدُ

هەركەس پەیڕەو و پرۆگرامەکەم ببینێ دەزانێ کە بریتیە لە کڕنوشبردن بۆ خودا و نهێنیەکە ئەمەیە ، ئەوەشی سوجدە ببات دەمبینێت کە ڕێبواری ڕێگای گەشتن بە خودام ، جامی ئەویندداریمان بە بەڵگە و ڕێنوێنی پڕ بووە ، ئەوەی تینوی بێت بەو جامە تینیەتیەکەی دەشکێت و ئەوانە دەیخۆنەوە کە تینیان بۆ هاتووە

فرح يا خؤن النفس بالنفسِ ضائعاً

فمظهرنا بالعزِّ للحشر خالدُ

ونجمك عن سقف العنايات ساقطٌ

وكوكبنا في رفرف السعدِ صاعدُ

ئەی ئەو کەسەی ناپاکیت لەگەڵ دڵی خۆت کردووە ئەوەی ونت کردووە وەرە بیدۆزەرەوە ، ئێمە دیمەنی سەربەرزی و شکۆین و لە ڕۆژی دواییدا ناو و یادمان دەمێنێتەوە ، ئەستێرەی تۆ لە ئاسمانەوە دەکەوێتە خوارەوە و هەسارەی ئێمە لە ئاسماندا دەشەکێتەوە و بەرزتر دەبێتەوە

## شیعری هەشتەم : منن الرفاعي الرفيع الهمة

مِنَن الرفاعي الرفيع الهمَّة ثبتت بكل قضيةٍ كلية

باب الرسول المصطفى وحبيبه شيخ الوجود وفرد كل مزيَّة

فەزڵ و پـێگەی شـێخی ڕیفـاعی شـکۆدار جێگیـر بـووە لە هەمـوو بابەتێکـدا ، کە ئەو دەرگـای حەزرەتـی پەیـامهێنەرە و خۆشەویسـتی ئەو ، شـێخی بـونەوەران ، تـاک و کەم شێوە

كنز الحقائق تاج أقطاب الأمم خضعت له عرب المشيخ والعجم

في دورةِ الغجلال مرقاه انبهم وأولو العلى حارت بذي الدورية

گەنجینـەی ڕاسـتیەکان و تـاجی پیـرە جەمسـەرگرەکان ، کە عەرەب و عەجەم هەمـوو بـۆی ملـکەچ بـوون ، لە دەوری ئەودا هەمـوو بـوون بە پەروانە و ئەوانەی پـایە و پێگەیان هەبوو لەبەر دەرگانەی ئەودا ملکەچ بوون

غوث الرجال وحالهم من حاله وقد استظلَّ كبارهم بظلاله

هم يقتدون تحققاً بكماله سيراً على أخلاقه المرضيَّة

فەریادڕەســی خوداویســتانه و ئەوەی بەســەریان دێــت لە حــاڵ و ئەحــواڵ لەوەوەیە و گەورەی خوداویســتانیش خــۆی خســتووەتە ژێــر ســێبەری ، ئەوان بەبــێ گومــان و شــک شوێن ئەو کەوتوون و ڕێگای ڕەوشتبەرزی ئەویان گرتۆتە بەرز

أسدٌ حسينيٌّ مطمطمُ سرَّه غرقت صدور الأولياء ببحره

فالبحر كان كنقطةٍ في بره والبرُّ حبَّةُ خردلٍ جزئيةٍ

شــێرێکی حوســەینیە کە نهێنیەکــانی هێنــدە قــوڵن کە زۆرکەس درکــی پــێ ناکــات ، بە دەریــای خــۆی دڵــی دۆســتانی خــودای نــوقم کــردووە ، دەریــا وەک خــاڵێکە لە چــاو زەوی ئەودا و زەویش وەک دەنکە خەردەلێکە لەچاو مەیدانی فراوانی ئەو

مددٌ بدا من ربنا لجنابه ذلَّت سباع الغاب في أعتابه

ما القطب إلا خادمٌ في بابه جلَّت مراتبه عن القطبيَّة

فەریادڕەسیەک کە لە خوداوە بۆ ئەو هاتووە وەها پێگە و پایەی بەرزکردۆتەوە کەوا هەموو شێرەکان سەری بۆ دابنوێنن ، جەمسەرگیرەکان تەنها خزمەتکارێکن لەبەردەرگای ئەو ، پێگەی شێخی ڕیفاعی لە جەمسەرگیریش بەرزترە

صلى الإله على الرسولِ وسلَّما بحقائقِ تغدو لمثلى سلَّما

والآلِ والأصحاب طرًّا كلَّما فتح البساط لسادةٍ صوفيَّةِ

**سەڵەوات و سەلامی خودا بڕژێت بەسەر پایەمهێنەر بێ ئەندازە بەو جۆر و شێوەیەی تەنها خودا دەیزانێت ، هەروەها بەسەر ئالوبەیت و یاوەران بە بەردەوامی هەرکات فەرش ڕاخرا بۆ مەردانی سۆفیگەری**

## شیعری نۆیەم : إذا ما ذكرنا حیدرا في مهمة

إذا ما ذكرنا حيدراً في مهمَّةٍ

تحدَّرَ فيه الكربُ كالسيل من علي

تجلَّت باذن الله وانقشع البلا

وجاءت لنا الغارات كالبرق من علي

**هەرکـات هـاوار لە حەزرەتـی عەلـی بکەیـن و نـاوی بهێنـین بـۆ کارێـک ، ئەوا هەرچـی بەڵا هەیە بە هیمەتـی عەلـی وەک بـاران ڕۆدەچێـت و نامێنێـت ، پشـت بەخـوا ئەو ناخۆشـی و نەهـامەتیە لادەچێـت و فەریادڕەسـی هاوشـێوەی هەورەبروسـکە لەلایەن حەزرەتی عەلیەوە بۆمان دێت**

## شیعری دەیەم : للتجلي من طيه أسرار

للتجلي من طيِّه أسرار

تنجلي من نماطها أدوار

فمتى ما جلى على القوم كأساً

ظهرت فيهم له آثار

**هەرکـــات خـــودا نهێنیەکـــان دابـــارێنێتە ســـەر ڕێبـــوارانی ڕێگـــای خـــۆی ، ئەوا لەو نهێنیـانەوە چەنـدین دۆخـی تـایبەت بەسـەر موریـدەکان دێـت ، هەرکەس جامێـک لە شـــەرابی خۆشەویســـتی بـــدرێت پێیـــان ، ڕاســـتەوخۆ کـــاریگەریەکەی دەردەکەوێـــت لەسەریان**

## شیعری یانزدەهەم : تقيل المناي تحت أقدام جندنا

تقيل المناي تحت أقدام جندنا

وكلُّ الرزايا حافلات بضدِّنا

فيا أيُّها الموصول قلباً بعهدنا

توسَّل إذا ضاق الخناقُ بجدِّنا

**ئەوەی ڕووبەڕوومان بوەستێتەوە دەبێتە خاکی ژێر پێی سەربازەکانمان ، سەرەڕای ئەوەش دەبینین لە زۆر لاوە دوژمنایەتیمان دەکرێت ، ئەی ئەو کەسەی دڵت بەستۆتەوە بە ڕێباز و ڕێچکەی ئێمەوە ، لەکاتی نەهامەتی و ئاستەنگی دروست بوون داوا لە خودا بکە بە ڕاهو جاهی باپیرەمان**

أبي العلمين الغوث والنصر حاصل

له باليد البيضاء عزٌّ سما السما

ولا بدع مولانا الرفاعيُّ إن سما

مليك فتوحٍ بالندا بحره طما

**پیری دوو بەیداغ ، فەریادڕەسی سەرفرازکراو ، کە دەستی سپی ئەو لە ئاسمانەکان جێگیر بووە ، داهێنراو نییە ئەگەر بە پێشەوامان شێخی ڕیفاعی بوترێت کەوا پادشای سەرفرازبوونە و دەریاکەی بێ بنە**

فطوبي لذي قلبٍ لسدَّته انتما

وقد ربطت بالسر منه السلاسل

**خۆشحاڵە ئەو دڵەی خۆی بەوان پەیوەست بکات ، ئەو پەیوەندیە نهێنیەکی خودایی دەبێت کە دەیبەستێتەوە پێمانەوە**

## شیعری دوانزدەهەم : قالوا تحب عليا قلت مبتهجا

قالوا تحب عليا قلت مبتهجاً

ديني ومعراج أسراي ولاء علي

ألهاشمي هزبر الآل سيدهم

رأس الدواوين فيهم روح كل ولي

وتیان ئیمامی عەلیت خۆش دەوێت ، بەجۆش و خرۆشیەوە وتم کەوا ئەو ئاینی منە و بەرزبوونەوە و پایەبەرزبوونم بە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی حەزرەتی عەلیە ، کە هاشمیەکی مەرد و چاونەترس بوو و گەورەی ئالوبەیت بوو ، سەرقافڵەی هەموویانە و ڕووحی هەموو خوداناسانە

ألواضح الشرف الكرار سين سنا

سرارة المدد الهامي من الأزل

رمز الإشارة في أهل الحقيقة نب

راس الهدى صنو طه سيد الرسل

**ئەو زاتەی پێکە و ناوبانگی ڕوونە ، لە بنەڕەتەوە خودا سەرفرازی کردووە و شێری ئەم مەیدانەیە ، هێما و نیشانەیە بۆ ڕێگەی ڕاستی و سەرچاوەی ڕێنمایی و ڕێنوێنی کردنە بۆ ڕێگای ڕاست کە پەروەردەی دەستی طاهای گەورەی پێغەمبەرانە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی)**

فهل ثوت فاطمٌ في غير قبَّته

وهل أتي هل أتي ألا به فقل

أتى وليا لأهل الله يجذبهم

بجذبة المصطفى للعلم والعمل

**ئایا هیچ پێکەیشتوویەک هەبووە کە لە ژێر کومەزێکی تر جگە لە کومەزی ئەو نیشتەجێ ببێت ؟ ، هەرکەسیش هاتبێتە سەر ڕێگای ڕاست مەگەر هەر بە ئەو نەهاتووەتە سەر ڕێگاکە ؟ بۆیە بڵێ پیاوچاکێکی گەورە هاتووە بۆ خوداناسان کە بە کەمەندکێشی حەزرەتی موستەفا ڕایاندەکێشێت بۆ زانست و کردار**

## شیعری سیانزدەهەم : أدار أحبتي و الحب دین

أدار أحبَّتي والحُبُّ دينٌ

قد انطبع الولوهُ على هواك

تعشقَّك الفوآد فصرتِ فيه

وصرتُ متى أرى ذاتي أراكِ

**خۆشەویستانم پشتیان تێکردم ، لە کاتێکدا خۆشەویستی بووە بە ئاینێک ، پەیوەست بوومە بە خۆشەویستیت ئەی خودا ، دڵ بەشێوەیەک ئەویندارت بووە کە تۆی تێدایت ، وام لێهاتووە کە هەرکات خۆم ببینم ئەوا تۆ دەبینم**

## شیعری چواردەهەم : إلى النجف العلي تساق منا

إلى النَّجف العلي تساقُ منا

على شغفٍ مطياتُ القلوبِ

لبابِ مدينة العلم المعلى

وصيِّ نبيِّ علامِ الغيوبِ

**بۆ نەجەفی پیرۆز و شکۆمەندە کەوا دڵمان بە پەرۆشیەوە تامەزرۆی دیدارە ،بۆ دەرگای شاری زانستە باڵاکان ، جێگەداری حەزرەتی پەیامهێنەر و زانا بە پەنهانەکان (لێرەدا مەبەست لێی حەزرەتی عەلی یە)**

## شيعرى پانزدەهەم : آل النبي الطاهر المصطفى

آل النبيِّ الطاهر المصطفى

لا شكَّ مخذولٌ معاديهمُ

وفي غدٍ يحفظُ حقاً بهم

من لفحةٍ النارِ مواليهم

**بنەماڵەی پەیامهێنەری پاک حەزرەتی موستەفا ، گومانی تێدانیە هەرکەس دوژمنایەتیان بکات سەرشۆڕە ، لە دواڕۆژدا بەهۆی ئەوانەوەیە کە خۆشەویستانیان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێ**

لهم من الله بطيٍّ الخفا

عنايةٌ تحرسُ ناديهم

وكلُّ كربٍ مزعجٍ مسَّهُم

بشارةٌ تعلى معاليهمُ

**له خوداوه فه‌زڵێکیان پێ به‌خشراوه که‌وا پارێزراوی کردوون و پاراستویانیه‌تی ، هه‌ر به‌ڵا و نه‌هامه‌تیه‌کیشیان به‌سه‌ر هاتبێت له به‌رامبه‌ردا خودا مژده‌ی که‌وره و کرنگی له‌به‌رامبه‌دا پێ داون**

ذنوب أهل البيت مغفورةٌ

وهاتف العفو يناجيهم

يختم بالخير لهم والرضا

يشمل بالبر مواليهم

**تاوانی بنه‌ماڵه‌که‌ی لێبوردراوه ، لێبوردنی خودایی هه‌میشه بانگهێشیان ده‌کات ، دوارِۆژیان ده‌کاته خێر و ڕه‌زامه‌ندی بۆیان و ئه‌م لوتف و ڕێزه‌ی خودا لایه‌نکریشیان ده‌گرێته‌وه**

أحبابهم في جنةٍ عندهم

والنار تصلى لأعاديهم

والغوثُ من سدرة قدس العلى

يحفُّ ملهوفاً يناديهمُ

**خۆشەویستانیان لە بەهەشتن لەلای ئەوان و دۆزەخیش چاوەڕوانی ئەوانەیە کە دوژمنایەتیان دەکەن ، غەوسەکان کە پایەیان چەندە بەرزە لەلای خودا  بەڵام بە جۆش و خرۆشەوە بانگی بنەماڵەی پەیامهێنەر دەکەن**

آياتهم مثل نجوم السما

في حاضر الناس وباديهم

من مات مأموناً على حبهم

يعدُّ إبانَ اللقا فيهمُ

اللهُ أعلى في الورى قدرهم

وشاد بالدين مبانيهمُ

**فەرمایشتەکانیان وەک ئەستێرەکانی ئاسمان بەرزە و لەنێو خەڵک بڵاوە ، هەرکەس لەسەر خۆشەویستیان بمرێت ئەوا مژدەی پێ دەدرێت بە شادبوونەوە پێیان ، خودا پلە و پێگەیانی بەرز کردووە و ئاینی پتەو و بەهێز کردووە بە خانوو و باڵەخانەکانی بنەماڵەی پەیامهێنەر**

## شیعری شانزدەهەم : إلیک إیاه رباه والليل فاحم

إِليك أَيا رَبّاهُ واللّيلُ فاحمٌ

أُنادي بقلبٍ أنت تعلم سِرَّهُ

فخذ بيدي يا كاشف الضرِّ رحمةً

وإنكَ للمظطرِّ تكشف ضُرَّه

دعاك عبيدٌ مسَّهُ العسر والقلا

أَغثهُ ويسر بالعناية أَمرَهُ

بۆ تۆ ئەی خودایە بەم شەوە تاریکەی لە شێوەی خەڵوزە بە دڵەوە ناوت دێنم کە خۆت دەزانیت دڵم چی تێدایە و چی پێویستە ، دەستم بگرە ئەی لابەری بەڵا بە بەخشندەیی و میهرەبانی خۆت و هەرکەس ناچار بێت لە توانای تۆیە کە بەڵا و نەهامەتیەکەی لەسەر لاببەیت ، بەندەیەک کە نەهامەتی و ئاستەنگی بەسەر هاتووە ، تۆ کاری ئاسان بکە و پشت و پەنای ببە

## شیعری حەڤدەهەم : إطرح الدنيا ولا تعبأ بها

إطرح الدنيا ولا تعبأ بها

فهي لو حققت يا خل سنه

مدة العمر بها مهما علت

رمشةٌ لو أنها ألف سنه

**واز لە دونیا بهێنە و شوێنی مەکەوە ، خۆ ئەگەر دونیا هەموو تەمەنتی تێدا بەسەر ببەیت ئەوا چەنێک زۆریش بێت وەک پرتەیەکی چاوە تەنانەت ئەگەر هەزار ساڵیش بژیت**

## شيعری هەژدەهەم : نزه فؤادک عن محبة غيره

نَزِّهْ فُؤادَكَ عن مَحَبَّةِ غَيرِهِ

فالغَيرُ يَفْنى والحَوادِثُ تَنْطَوي

والجَأْ لِعِزَّتِهِ وَدَعْ وَهْمَ السِّوى

فَسِواهُ مَحْضُ العَجْزِ واللهُ القَوي

**دڵت خاوێن و بەتاڵ بکەرەوە لە خۆشویستنی جگە لە خودا ، چونکە جگە لەو هەمووی لەناو دەچێت و دونیا دەپێچرێتەوە و نامێنێت ، پەنا بهێنە بۆ خزمەت شکۆمەندی خودا و واز لە خەیاڵکردنی جگە لە خودا بهێنە ، هەموو ئەوانەی جگە لە ئەون بێدەسەڵاتن و تەنها خودا دەسەڵاتدارە**

## شیعری نۆزدەهەم : يا ابن الرفاعي الذي ذاته

يا ابنَ الرِّفاعِيِّ الَّذي ذاتُهُ

قامَتْ عنِ المُخْتارِ بُرْهانا

في كُلِّ يومٍ مِنْكُمُ آيَةٌ

تَزيدُنا باللّٰهِ إِيمانًا

**ئەی ڕۆڵەکەی ڕیفاعی (واتا سەید ئەحمەدی ڕیفاعی) کە بوو بە جێگەداری پەیامهێنەری خودا و بەڵگە لەسەر گەورەیەتی پەیامهێنەر ، هەموو ڕۆژێک لە تۆوە شتێک دەبینین کە زیاتر بیروباوەڕمان بە خودا پتەوتر دەکات**

## شیعری بیستەم : أي قلب هام فيكم و سكن

أيُّ قلبٍ هامَ فيكُمْ وسكَنْ

أَو تَوالى غيرَكُمْ طولَ الزَّمَنْ

يا أُحَيْباباً سَقانا وَجْدُهُمْ

كأسَ آلامٍ وأَنواعِ مِحَنْ

**کامەیە ئەو دڵەی ئەویندارى ئێوە بووە و ئێوەی تێدایە ؟ یاخود کامەیە ئەو دڵەی کە جگە لە ئێوەی تێدابوبێت بە درێژایی سەردەمەکان ، ئێـوە خۆشەویستێکی ئێمەن کەوا دووریتان چەندین جۆر نەهامەتی و ئازاری پێ چەشتین**

كلَّما البرْقُ اليَمانِيُّ الْتوَى

حنَّ قلبي لنَواحيكُمْ وأنْ

عن هَواكُمْ أخَذَ القَلبُ البِلى

وأَداةُ الجَرِّ فيكُمْ هي عَنْ

**هەرکات پریشکی بروسکە لە یەمەن دەرکەوێ ، دڵی من بۆ ئێوە دەناڵێنێت و دەنوزێنێت ، لە خۆشەویستی ئێوەیە دڵم نەهامەتی چەشتووە ، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە لە ئێوەوە ئەو خۆشەویستیە هاتووە**

أَفْرَطَ العاذِلُ في نُصحي بِكُمْ

ليتَ شِعْري بهدَ هَذا هوَ مَنْ

والأَماني لم تزَلْ طافِحَةً

يا لَعَمْرِي إِنَّها بعضُ الفِتَنْ

**ئەوەی پەیوەست بووبوو پێتان زیادەڕۆیی کرد لە ئامۆژگاریکردم بە ئێوە ، خۆزگایە بمزانیبایە ئەو کەسە کێیە کە پێی پەیوەستم تا لە شیعرەکانم بەشی خۆی پێ بدەم ، هێشتا هەر ئاواتی ئەوەم هەیە ئەو کەسە بناسم و بزانم کێیە ، ئەم غەفڵەتەم من لە ناسینی ئەودا سوێند بە تەمەنم جگە لە ئاشوب و ئاژاوایەک هیچی تر نییە**

سَكَني حيثُ سَكَنْتُمْ وسِوى

ما سَكَنْتُمْ ليس لي فيهِ سَكَنْ

وحِماكُمْ وحِماكُمْ وَطَني

ومنَ الإِيمانِ حُبُّ للوَطَنْ

**شوێنی نیشتەجێبوونی من ئەو شوێنەیە کە ئێوەی لێ نیشتەجێ ببن ، لەهەرکەوێ ئێوە نیشتەجێ نەبن شوێنێکی تێدا نابێت بۆ منیش ، شوێنی ئێوە نیشتیمانی منە ، لە بیروباوەڕیشدا هاتووە کە خۆشەویستی نیشتیمان لە باوەڕدارێتیە**

إنَّما أُمُّ عُبَادٍ مَكَّتي

وإليها وِجْهَتي من كلِّ فَنْ

بُغْيَتي بل مُنْيَتي ساكِنُها

كم على حَبْلي بالإِيصالِ مَنْ

**ئوم عوبێدە (مەزارگەی شێخی ڕیفاعی تێدایە) مەککەی منە کە ڕووی تێدەکەم بۆ بەدەستهێنانی هەموو هونەرێک ، مەبەست و ئاواتم ئەو کەسەیە کە تێیدا نیشتەجێیە ، ئەوە پەتی بەستنەوەمان بە خودا و فەزڵی بەسەرماندا هەیە**

نائبُ المُخْتارِ عينُ المُرْتَضى

وارِثٌ عَليا حُسَيْنٍ والحَسَنْ

## سيِّدي الغَوْثُ الرِّفاعِيُّ الَّذي

## نابَ خيرَ الخَلْقِ بالخُلْقِ الحَسَنْ

**جێگەداری پەیامهێنەر و نووری چاوی حەزرەتی عەلی ، جێگەداری حەزرەتی عەلی و حەسەن و حوسەین ، پێشەوام فەریادڕەسی ڕیفاعی ئەو زاتەی کە بوو بە جێگەداری باشترینی بونەوارن (حەزرەتی موحەمەد) بە ڕەوشت و ئاکار جوانی**

## شیعری بیست و یەک : یا رجال الغیب أین الهمم

یا رجالَ الغیبِ أینَ الهِمَمُ

وأَیادیکُمْ وأینَ الشِّیَمُ

حرِّکوا العزمَ وثُوروا غَیْرَةً

فلَنا منکم لَعَمْري رَحِمُ

**ئەی پیاوانی زانستی پەنهانی و ئەی پەنهانناسان کوا پشتیوانی و ورەپێدانتان ، کوا دەستتان و کوا پلە و پێگەتان ؟ ، ورەمان بەرز بکەن و شۆڕش بەرپا بکەن ، سوێند بە تەمەنم لە ئێوەوە بەزەییەک دەبێت هەبێت بۆ ئێمە**

وانْشُروا أَعلامکُمْ عن نجدَةٍ

کلُّکم یا قومُ فردٌ عَلَمُ

یا رِجالَ اللهِ یا أَهلَ الوَحا

لاحِظونا ها هو الدَّمعُ دَمُ

ئاڵا و بەیداغەکانتان بڵاو بکەنەوە لەپێناو فەریادڕەسی ، هەمووتان ئەی پەنهانناسان لە وێنەتان نییە و هەمووتان بۆخۆتان ئاڵا و بەیداغێکی بەرزن ، ئەی پیاوانی خودا ئەی ئەوانەی بەخێرایی فریامان دەکەون ، تێبینیمان بکەن و بڕوانن ئەوەتا فرمێسکەکانمان بووە بە خوێن

بدِّلوا العُسْرَ بيسرٍ أَبيضٍ

فلكم يُنْمى السَّخا والكرَمُ

يالَ بيتِ المُصْطَفى من هاشِمٍ

عنه أَنتمْ في البَرايا قُوَّمُ

نەهامەتی و ئاستەنگی بگۆڕن بۆ ئاسانکاری و خۆشی ، هەر ئێوەن کە بەخشندەیی و دەستکراوەییتان لێ چاوەڕوان دەکرێت ، ئەی بنەماڵەی حەزرەتی موستەفا لە بنەماڵەی هاشم ، لەنێوان خەڵکدا لەدوای ئەو ئێوەبوون بە بنەماڵەی

مسَّنا الكربُ فقُوموا علَناً

وأَغيثونا وجُودوا وأنْعِموا

واضْرِبوا الخصمَ بسهمٍ قاتِلٍ

كم وكم ثارَتْ شُؤونٌ منكُمُ

يا أَساطينَ الحِمى يا سَادَتِي

رضِيَ اللهُ تعالى عنكُمُ

**بەڵا و نەهامەتیمان بۆ هات ، بە ئاشکرا هەستن و هەڵوێست بنوێنن ، فەریادڕەسمان ببن و لێمان بڕوانن و هاوکارمان بن ، تیرێکی کوشندە بدەن لە دوژمن ، چەندین هەڵوێستی مەردانە لە ئێوە بینراوە کە نایەت لە ژماردن ، ئەی دڵبەرەکان ئەی گەورەکانی من ، خودا لە ئێوە ڕەزامەند بێت**

## شیعری بیست و دوو : أرأیت سوق الحب کیف یقام

أَرَأَيتَ سوقَ الحُبِّ كيفَ يُقامُ

القَوْمُ ذُهْلٌ والرِّجالُ قِيامُ

يتَزاحَمونَ إلى العُلى بقُلوبِهِمْ

هاموا وفي ذاكَ المَقامِ تَرامُوا

**بینیوتە بازاڕی خۆشەویستان و ئەویندارانی چۆن دادەمەزرێت ؟ خەڵکەکە سەریان سوڕماوە و پیاوانی ئەو بازاڕە بەپێوە ڕاوەستاون ، هەمووان بە دڵیان قەرەباڵەغیان دروست کردووە بۆ پایەبەرزبوون ، مەست بوون و لەو پێکە و پایەیە ئاستەنگیان لە جموجۆڵدا دروست کردووە**

أَخَذوا أَساليبَ القُلُوبِ إِفاضَةً

ومن الغُيوبِ إلى القُلُوبِ نِظامُ

وتَعَلَّموا العِلمَ الخفِيَّ بسِرِّهِمْ

فهُمُ بمشْهَدِ ذَوْقِهِ أَعْلامُ

**شێواز و ڕێکاکانی گەیشتنی دڵیان بە خودا لە زانستی پەنهانی و پەنهانناسیەوە لە ڕێکەی حەزرەتی موحەممەدەوە ڕژا بە سەریاندا ، زانستی پەنهانی بە نهێنیەکانی خۆیان فێربوون ، هەربۆیە پایەیان بەشێوەیەک بەرز بوو بوون بە ئاڵا و باڵا لەنێوان خەڵکدا بەو تێڕوانینەی خودا لێیانی کرد**

عَرَفَتْ لَيالي الدَّهرِ زَمَّةَ جيشِهِمْ

طَوْراً وقد شَهِدتْ له الأَيَّامُ

جَيشٌ أَبو الزَّهْراءِ قامَ إمامَهُ

فلَنِعْمَ جَيْشٌ بل ونِعْمَ إِمامُ

**شەوانی ڕۆژگار زانی کە لەشکری ئەمانە چەندە بەتوانایە ، ڕۆژگار بوو بە شاهید لەسەر ئەمە ، لەشکرێک کە باوکی زەهرا (حەزرەتی پەیامهێنەر موحەممەد) ببێتە پێشەوایان ، ئەوا باشترین پێشەوا و باشترین لەشکرە**

## شیعری بیست و سێ : سر بطريق الله حتى المنتهى

سرْ بطريقِ اللهِ حتَّى المُنْتَهى

إذْ ليس للإنسانِ إلاَّ ما سعَى

وقفْ على البابِ الإلهِيِّ وكنْ

مُقتفِياً بالصِّدقِ إثرَ المُصْطفى

**ڕێگای خودا بگرەبەر هەتا کۆتایی ڕێگاکە ، بزانە کەوا مرۆڤ تەنها ئەوەی لە پێناویدا هەوڵ بدات بۆی دەمێنێتەوە ، بوەستە لەبەردەم دەرگانەی خودایی و بە ڕاستگۆیی ڕێگای شوێنپێی حەزرەتی موستەفا (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بکەوە**

وصحِّحِ النيَّةَ في الدِّينِ فما

للعبدِ عند الرَّبِّ إلاَّ ما نوَى

وسلسِلِ الدَّمعَ على الخدِّ دُجًى

فكم جرَى الخيرُ إذا الدَّمعُ جرَى

**مەبەست و نیازت لە ئایندا ڕاست بکەرەوە ، ئەوەی بەندە بیەوێت و لای خودا هەژمارکراو بێط ئەوەیە کە مەبەستی دڵی بێت ، با فرمێسک بەردەوام بەسەر ڕوومەتت برژێ و بێتە خوار ، چەندە خێر و خۆشی دەڕژێت بەسەرتدا هەرکات فرمێسک بڕێژی**

وحاذِرِ الغفلَةَ أنْ تُبلى بها

فما مُحِبٌّ حاذِقٌ كمن سهَا

وكنْ مع الشَّرعِ ولازِمْ حكمَهُ

فظُلمَةُ القبرِ جَزاءُ من عدَا

**ئاگاداری بێئاگایی بە کە توشی ببیت ، خۆ ئەوکەسەی ئەویندارە وەک ئەو کەسە نییە کە بێئاگایە ، لەگەڵ شەریعەتدا بە و پابەند بە پێوەی ، تاریکی گۆڕ پاداشتی ئەوەیە کە لەو ڕێیە لابدات**

وإِنْ دُعيتَ لكلامِ المُصْطَفى

أَطِعْ وحاذِرِ لا تكنْ كمن طغَى

فأَمرُهُ عن ربِّهِ وإِنَّهُ

لم يَنْطِقَنْ وحقِّهِ عن الهوَى

ئەگەر فەرمایشتێکی حەزرەتی موستەفات (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بۆ خوێندرایەوە ، ئەوا گوێڕایەڵی ببە و مەبە لەو کەسانە بێگوێی دەکەن ، ئەوەی ئەو بیفەرموێت ئەوا خودا فەرموویەتی و هەرگیز ئەو لەخۆیەوە هیچی نەفەرمووە سوێند بە هەرچی ماف و پایە هەیە کە هەیەتی

ولا ترَ النَّفسَ فإنَّ الدَّاءَ أَنْ

يُكابِرَ المرءُ أوِ النَّفسَ يَرَى

وفارِقِ الخِلَّ الذي طريقُهُ

مُجْتَذِبٌ زِمامَهُ إلى الغَوَى

هەرگیز خۆت بە شت مەزانە چونکە نەخۆشیە کەسێک لوتبەرزی بنوێنێت و خۆی لەلا شت بێت ، دووربکەوەرەوە لەو هاوڕێیەی کە ڕێگاکەی بەرەو گومڕایی دەڕوات

ورافِقِ التَّقيَّ واغْنَمْ وقتَهُ

فلذَّةُ العيشِ بأَصحابِ التَّقَى

وارْوِ كلامَ المُصْطَفى مُحَقَّقاً

ما كُلُّ راوٍ إنْ روَى القولَ رَوَى

دۆستایەتی چاکان بکە و سود لەو کاتانە ببینە کە لەگەڵیاندایت ، چێژی ئەم ژینە بە هاوەڵی ئەوانە ، ئەو فەرمایشتانەی کە ڕاستن لە حەزرەتی موستەفاوە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) و کومانیان لەسەر نەماوە بیگێڕنەوە ، چونکە مەرج نییە ئەوەی بگێڕدرێتەوە ڕاست بێت

واسْرِ مع القومِ على آدابِهِمْ

عندَ الصَّباحِ يحمدُ القومُ السُّرَى

وسلِّمِ الأمرَ لمولاكَ وكنْ

مُعتصِماً بحبلِهِ عن السِّوَى

لەگەڵ ڕێچکەگران (ئەهلی تەریقەت) بەڕێکادا برۆ لەسەر ڕێڕەو و پەیڕەوی ئەوان ، ئەوان هەر لە بەرەبەیانەوە سوپاسی خودا دەکەن و نهێنی ڕێچکەکەیان دەپارێزن ، خۆت بسپێرە بە پەروەردگارت و دەست بگرە بە پەتەکەیەوە و پەتەکانی تر بەربدە

## شیعری بیست و چوار : عليكم وإلا فالبكاء مضيع

عَلَيْكُمْ وإلاَّ فالبُكاءُ مضيعُ

وفيكُمْ وإلاَّ فالرَّجاءُ قَطيعُ

وعَنكم وإلاَّ فالأحاديثُ ضِلَّةٌ

ومنكمْ وألاَّ فالنَّوالُ وَضيعُ

**گریان لە پێناو ئێوەدا بەهای هەیە ئەگەرنا بەفیرۆ دەچێت ، لەڕێی ئێوەوە پاڕانەوە دەکەین ئەگەرنا پاڕانەوەمان پچڕاوە**

## شیعری بیست و پێنج : طیبوا بنا نحن طیب

طيبوا بِنا نحنُ طِيبٌ

لروحِ كلِّ مُحِبِّ

**خۆتان بە ئێمە تیمار بکەن ئێمە تیمارسازین بۆ ڕوحی هەموو ئەوینداران**

## شیعری بیست و شەش : لا تصر غافلا عن الذكر يوما

لا تُصِرْ غافلاً عن الذِّكرِ يوماً

إنَّ في الذِّكرِ راحةَ الأرواحِ

احْفظِ الله واذْكُرَنْهُ دَواماً

ذِكرُهُ للرِّجالِ ماضي السَّلاحِ

**هەرگیز نەکەی ڕۆژێک بێئاگا بیت لە یادی خودا ، یادکردنی خودا ڕووحەکان ئارام دەکاتەوە ، هەردەم یادی خودات با لەدڵدا بێت و یادی بکە بە بەردەوامی ، یادکردنی ئەو چەکی ڕاستەقینەی پیاوانە**

تَطمئِنُّ القُلوبُ فيه بنصٍّ

هكذا الذِّكرُ باعِثُ الإنْشراحِ

واعْبُدِ الله ما قَدِرْتَ بِصدقٍ

إنَّ هذا طريقُ أهلِ الصَّلاحِ

**دڵەکان بە یادی ئەوە کە ئارام دەبنەوە و دەبنە هۆی گەشانەوەی مرۆڤ ، خودا بپەرستە بە ڕاستگۆیی و بزانە کەوا ئەم ڕێگایە (ڕێگای ئەهلی تەسەوف و دەروونخاوێنکاران) ڕێگای چاکبوون و سەرفرازیە**

## شیعری بیست و حەوت : عهدت طریقتنا أصولا خمسة

عُهِدتْ طَريقَتُنا أُصولاً خمسَةً

تَوحيدُ بارينا وحُبُّ المُصْطَفى

والأَخذُ بالشَّرْعِ الشَّريفِ تحَقُّقاً

رَغماً لمن بالزُّورِ والشَّطْحِ اكتَفَى

**ڕێباز و ڕێچکەی ئێمە پێنج بنچینەی هەیە ، یەکخواپەرستی و خۆشویستنی حەزرەتی موستەفا (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، هەروەها پابەندبوون بە شەرعی پیرۆزی ڕاستەقینە ئەگەرچی کەسانێک بیانەوێ بە درۆ و قسەی بەرز و نزم پابەند بین**

ومَوَدَّةُ السَّاداتِ من أَبنائِهِ

والصَّحبِ بل والتَّابِعينَ أُولي الوَفَا

ومحبَّةُ الغوْثِ الرِّفاعِيِّ الَّذي

نهْجَ النَّبِيِّ على محَجَّتِهِ اقْتَفى

**خۆشویستنی سەیدەکان لە نەوەی ئەو و یاوەرانی و شوێنکەوتوانی کە بەوەفا و وەفاداربوون بۆی ، هەروەها خۆشەویستی غەوس و فەریادڕەسی ڕیفاعی کە پەیڕەوکاری شەریعەتی پەیامهێنەرە و بە پەیڕەوی ئەودا ڕۆیشت**

هي تلكَ إن عُدَّتْ أُصولٌ خمسَةٌ

فيها لِداءِ القلبِ بالسَّيرِ الشِّفَا

فاجْعَلْ تحَقُّقَها لشأْوِكَ مِنْبَراً

فإذا ارتَقَيْتَ بها على الدُّنيا العَفَا

**ئەمانە ئەگەر ژماردت دەبنە پێنج بنچینەی سەرەکی کە چارەسەری دڵن بۆ ئەوانەی ئەم ڕێگایە دەگرنە بەر ، جێبەجێکردنی ئەم پێنج بنچینەیە بۆ ویست و مەبەستەکانت بکە بە بنەما بۆ ئەوەی لەم دونیایە سەرفراز و پایەدار بیت لەسەر ڕێگایەکی ڕاست**

## شیعری بیست و هەشتەم : بین بطاح حیهم و الأبطح

بينَ بِطاحِ حَيِّهِمْ والأبطحِ

طَرحْتُ روحاً عنهُمُ لم تَبْرَحِ

**لە ڕێکا و ڕێچکەی ئەواندا ڕووحم وەها پەیوەست بوو پێیانەوە کە نەیتوانی لێیان جودا بێتەوە**

# پێڕست